چاپکراوەکانی
سەنتەری روناکبیری هەتاو

ناوی کتێب : نزیکترین دووری
شیعری : نیازی حەمەعەزیز
نەخشەسازی : دلێر ئیبراهیم
تایپ : هێما نیازی
بەرگ : حەمە هاشم
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
چاپی یەکەم - 2007

## * پێشکەشە :

بەوکەسەی، لە نزیکترین شوێن دوورترین پارچەم بوو ..

# شیوەن

هەتا دوێنێ خەندەی دوو لێوی تەمەن بووی
هەتا دوێنێ تكەی ئاونگی چەمەن بووی
هەتا دوێنێ دیاریی ڕۆژگار بۆ ژیان بووی
ئاسۆی گەشی پڕشنگداری بەربەیان بووی
هەتا دوێنێ دەم لە ناو دەمی دونیا بووی
وەك گەردنی لووتكەی سەركەشی چیا بووی
هەتا دوێنێ لە دەریا كەشتی هیوا بووی
بۆ دوا ڕۆژی ئارامگاكەت وەك ئالا بووی
كەچی ئەمڕۆ بە ناكامی لە ناو گۆڕا
تابلۆی جەستەت بە سپێتی لە چاو گۆڕا !
نە ماچی كوڵمی هیوات كرد ، نە ژیانت
كەوا بەسترا كۆڕی شیوەن و گریانت

1978

# ژانی جودایی

لە شەونخونییەکانمدا ،
لەگەڵ یادەکانتا دەژیم
تاکو سیواد گڕی دووریت *
وەکو مۆم دەمتوێنێتەوە
نیوە شەوێکی خامۆش دێ و . .
ئەمامی خەمێکی دژوار
لە باخی دڵ دەڕوێتەوە
شەوانی ژیانی جودایی
ئەوەندە تاریک و سەختە
بڕوا بکە ،
تەنها بە گڕی سووتانی
گیانێك ڕۆشن نابێتەوە .

1978

* سیواد : تاریک و روونی بەیانیان .

# دوا ڕاز

نازەنینە بچکۆلەکە ..
خۆت بنوێنە بە ڕوخساری ئاوارەمدا
تا سەرنجی وێڵ و لێڵم
لە گەمارۆی دیمەنتدا
جەستەی خۆی بدۆزێتەوە !
نازدارەکەم ..
تەماشامکە
با هەستی چاوەڕێ و شێتم
لە قوڵایی چاوە ڕەشە جوانەکانتا بتوێتەوە !
دەستت بێنە
با بە پەنجە ساردەکانم

ئاڵۆزاوی و گرێکوێرەی

پە نجە سپییە ناسکەکانت بکرێتەوە !

دڵبەرەکەم ..

ڕێگام بدە

با ئارەزووی کۆڵەوارم

ئارەزووی کڵۆڵ .. هەژارم

لە ئامێزی مەیل و سۆزی ئەویندارییت

یەکجاری سەر بنێتەوە ! *

1978

* لە ڕۆژنامەی ( هاوکاری ) ژمارە 423 ی ساڵی 1978 بڵاوبۆتەوە .

# وێردی ئاواره

هەر دەڕۆم و ..
ددانی ڕۆژگاری نامۆیی
دەمجوێتەوە
هەر دەڕۆم و لە ناوجەرگەی
ئینجانەی گشت نوستنێکم
تۆوی خەونی بیرەوەری و
یادەکانی ئەوینی جاری جارانم
دەڕوێتـەوە
ئەو جارانەی ئاوم دەدی ،
ئەو ساتانەی
کە قژی سەوزی چیمەن و
گیای ئاسك و خاوم دەدی ،
ئەو کاتانەی کە

( لووتکەی بەفرینی ژێر ئاسمانی شین ) * و
پەنجەی درێژ و زەردی
هەتاوم دەدی
ولأتەکەم
هەرچەندە لێرەم .. لە غوربەتدا
بەلأم پەپوولەی گلێنەم
نووساوە بە شاشەی ڕوخسارەکانتەوە
خۆم لێرەم و
ناوکی دڵم خۆی خزاندۆتە توێکڵی
گەڕەکی شارەکانتەوە
من لای تۆم و نایەمەوە
نایەمەوە !

کووت / 1980

* دەربڕینێکی مامۆستا ( گۆران ) ە .

# مالآوایی

بۆ ( ئەمیرە )

بۆ جێم دێڵی ؟

من کێم هەیە لەتۆ زیاتر

دڵەکەی بکاتە بەرگ

بیکا بە خۆراك .. بەسێبەر

بۆ گیانە ئاوارەکەی من !

بۆچی دەڕۆی ؟

تەنها تۆم هەی

لە زمانی دڵم بگەی

تەنها تۆم هەی

ئاوازی قەدەغەکراوی

شەوانی سەختی زستانم

بە گوێکانت ئاشنا بکەی !

ئیدی گوێ لە کێ بگرم و

کێ ئاخی دڵ سوتێنەری من دەبیستێ

ئیدی کەشتیی ڕازەکانم

بێ بەندەری دڵەکەی تۆ

لە چ ڕۆخێکا بوەستێ ؟!

ڕەنگە نەتوانی جێم بێڵی

بە بیری پاکی نەژادت

بەیاری هەستم دەکێڵی

ڕەنگە نەتوانی جێم بێڵی ..

1984

## چۆن نەتۆرێم ؟

لێت تۆرام و ..

پۆلە مەلی خۆشەویستیم

لە شەقەی باڵیان داو فڕین

لێت ڕەنجام و ..

بڕیارم دا

چنگ لە هەورازی خەمی تۆ بکەمەوە

چۆن نەتۆرێم ؟

چۆن نەڕەنجێم ؟

واتدەزانی خۆشەویستی پێکەنینە

واتدەزانی دڵی عاشق

شانۆی ئاهەنگی مەستانە و

سەیرانگای سەوزی ئەوینە

نا .. گیانەکەم

ئەوەی دڵی نەسووتابێ

ئەوین لەلای گۆشتی کاڵە !

ئەوەی شەوێك لە شەوانی

جوداییدا نەگریابێ

تامی فرمێسکی بەخوڕو

هەنسکی گەرمی پێ تاڵە !

1983

* لە گۆڤاری کاروان ژمارە ( 29 ) ی ساڵی 1985 بڵاوبۆتەوە .

# تەزووی شادی

خۆشەویستم ..
کەتۆ ئاوە سازگارەکەی
( قولە ) ی شۆخ و
( کوێرەکانی ) ی بەلە نجە بای
بزانە منیش دەشتەکەی
( بیتوێن ) دەبوم
وەك بلووسك
بە ناخی پڕ لە ژیلەمۆمدا دەچۆڕای
دڵدارەکەم ..
گەر هاتبا و شا دەماری
خوێنی لەش بای
هەتیوی دەشتی گەرمیان و
برسیی کوێستانی بێبەش بای
منیش دەبووم
بە دڵی گەورەی ئەم شارە
بە گلێنەی ئێشکگرتووی
ئەو بنارە

منيش دەبووم
بە گوڵەگەنمی قەراج و
گڕی ژانگرتووی شەوانی
بابەگوڕگوڕی بێچارە !
تاقانەکەم ..
وا سێ ساڵە
لە ژووانی شیرینتا نەبێ
خەندە دیدەنی نەکردووم
وا سێ ساڵە ..
سێ ساڵی پڕ خۆشەویستی
سێ ساڵی جودایی و پەستی
وەك شوانی دوور لە بێری
سەدای بلوێرم نامۆیە
( مەم ) ی شیعرم دەستەبەستی
( زین ) ی نیگاکانی تۆیە !
وا سێ ساڵە منی کەساس
هیوای مژدەیەکم پێتە
کە تەزووی شادی ببەخشێ
بە دنیای ئەم دڵە شێتە !

1984

# ڕێژنەی ئازار

بۆ ا سەروەرا ی جوانەمەرگ

ئەی ئەستێرەی  ورشەداری

باوەشی ئاسمانی هیوا

ئەی تروسکەی جێ ئومێدی

ڕێبواری شەکەتی ڕێگا

بۆ ئاوا بووی ؟

خۆتۆ لە باخی تەمەندا

گوڵێکی تازە ساوا بووی

ئەستێرە ورشەدارەکە

ئەی عاشقی بووکی بەرزی

کۆچی خەمبەخشی گیانی تۆ

جودایی پڕ لە ژانی تۆ

ناسۆرێکە و

ڕێژنەی ئازار دەڕژێنێتە کێڵگەی ژیان

ماڵاواییت

بۆ پشکۆی سووری فرمێسك

باوەشی چاو ..

هەستی بە سوێ ..

دڵم ، دەکات بە ئاگردان

بە هیوا بووی بە میوانی

وەك نمە بارانی بەهار دابباری

بە هیوا بووی

ئەمجارەش هەروەکو جاران

هاتنەوەت بکەی بەدیاری

دەتویست لەگەڵ ئەم هاتنەت

چەپکێك نێرگز

بۆ یادگارییت بهێنی

گڕی سووری ئەم نەورۆزە

وەك چرۆی سەوزی داربەڕوو

لە ناخی دڵتا بڕوێنی

بەلام سەد داخ ..

وەك پەڵە هەورێكی نامۆ

ڕەشەبای مەرگ ڕایپڕفاندی

دەستی مردن

گەشەی ڕووخساری خاوێن و

بزەی سەر لێوی تۆراندی

نە چەپکە نێرگزی هیوات گەشایەوە

نە ئاگری بێنازی نەورۆزی ئەمساڵ

لە سەر لووتکەی

دڵە بەرز و گەورەکەتدا کرایەوە ! *

1985

* لە گۆڤاری ( کاروان ) ژمارە 37 ی ساڵی 1985 بڵاوکراوەتەوە .

# ئـاگـا

کە دەبیستم تۆ گریاوی
منیش ئاگر لە هەناوم بەردەبێت و
دڵ لە ئاخەوە داخ دەبــێ ،
کە هەست دەکەم ئازار و ژان
لە ئاسۆری لە مێژینەت تکە دەکات
من لێرەوە ،
بە هەردوو چاوی خوێنینم
مەرگی ڕەشی خۆم دەبینم !

1985

# تاسەی زیندوو

بۆ ( غ )

( گۆران هەزاران دڕکی باخانی

کردە دوژمنی بۆ گوڵێکی سوور ) *

لە پێناو بزەی تاقە شۆخێکدا

تەیدەکرد وڵات تاوەکو سنوور

سروشتی جوانی ئەم کوردستانە

تەزووی پڕ تینی هەست ونەستی بوو

ڕوخساری پاکی کیژانی تەڕپۆش

هەوێن و چێژی ناو هەڵبەستی بوو

ئەمڕۆش دەبینم ئەو تاسەگەرمە

لە مەزرای سەوزی ژینت هەر گەشە

بۆ چڵێ نێرگز بزەی شیرینت

موچڕکی شادیی گیان و لەشە

1985

* مامۆستا گۆران دەڵێ: ( لە هەر باخێ گوڵێکی سوورم دیبێ

بۆی چووم هەزار دڕکم لەپێ چەقیبێ)...

# چــــاو

دەڵێن :

( ئەوەی گەشت بکا بە نێو دەریادا

زریان و تۆف و کڕێوە

هەڕەشەی مەرگی لێدەکەن )

کەچی من بەم نیوە شەوە

ئەستێرەکان

لە قولاّیی چاوە شینەکانی تۆوە

بەرەو تیشکی خۆرم دەبەن !!

1985

# به هیوای ڕۆژێکی دی

بەیانییە .. دەوروبەرت

شارە مێرووی پڕ جە نجاڵە

جیهانێکە تۆزێک شیریـن

هەزار ئەوەندە خەمی تاڵە ..

خەندە و نیگای خێزانەکەت

پێخۆری نانی بەیانە

لابەری خەم و مەینەت و

تراژیدیای ئەم ژیـانـە

مەیدانــی کرێکارانــە

ژوانگەی هەموو بەیانیان

بەخۆت و خاکەنـــازەوە

ملت لێنا بە بێوەستان

مەیدان شێوەی پەرستگایە

ئی وەکو تۆی لێن یەکجار زۆر

ئی وەکو تۆی سەرما بردوو

یا سووتاوی بەر تیشکی خۆر!

کات درەنگە، چێشتەنگاوە

وای ، لە ژانی چاوەڕوانیت

ئەوا ئەمڕۆکەش بێکاری

وەك رۆژان هات بەمیوانیت

گەڕایتەوە بەرە و ماڵێ

نیگەران و خەفەتباری

بەلاَم دڵت بە خۆت نەما

چونکە تۆ یەك لە هەزاری

جاروبارە سەر هەڵدەبڕی

دیمەنـی ئاسۆ شیرینـە

چونکە جێ هیوای بەیانی و

ئایندەی تەمەن و ژینـە

1986

# نزیکترین دووری

جاران که دەهاتی بۆلام
بەقەد هەموو خۆشەویستیم
شادمانیێ بۆ دەهێنام
له لێوانی ناسکی رەنگ ئەرخەوانیت
ئاونگی بزەت دەڕشت بۆم
له پاش کەمێك
بەشێوەیەك تێکەڵ دەبووین
نەمدەزانی،
نه تۆ منی .. نه ئەمن تۆم
له دیدەنی ئەمڕۆکەشدا
دڵۆپە فرمێسکەکانت وەکو پشکۆن

بێ باكانە ، بە گڕی سوور .
دڵم هەروەكو مۆم دەخۆن

جاران بۆ تەنیا ژوانێك
سەدان كووچەت تەیدەكرد بۆم
ئێستاش لە نێوان من و تۆ
دووری ، تەنیا هەنگاوێكە و
كەچی بۆ تەنیا نیگایەك
هەزار هەزار خۆزگە دەخۆم
كە جاران پەنجەكانت بوون
بواری ماچیان لێ گرتبووم
ئەوا ئەمڕۆ
چەند شیشێكی ئاسنینە و
ڕایەڵ .. ڕایەڵ
تووند .. تووند داخراوە لە ڕووم
كە جاران لە چاوانتدا
تروسكاییەك گرتبووی تەم
ئەوا ئەمڕۆ لە قووڵایی گلێنەتدا

**ڕووخساری خۆر بەدیدەکەم**

**خۆشەویستم**

**لە خۆشیی ژوانی جاران و**

**ژانی دیداری ئەمڕۆکە**

**تەزوویەك دێ بە لەشمدا**

**تەزوویەکی پڕ شاد بیە**

**عیشقی هیوا و ئومێدێکە ..**

**خۆشەویستیی ئازادییە ( ***

1986

* ئەم شیعرەم لەو دیو شیشەکانی زیندانی ئەمنی رژێمی بەعس لەڕانیە نووسیوە .

* لە گۆڤاری ( بەیان ) ژمارە 132 ی ساڵی 1987 بلاوکراوەتەوە .

# تـەتـەر

ئەوەی هەڵگری هەواڵی

گیانی بەرزی کوردایەتی و

پێشمەرگەی مەزن و سەروەرە ،

ئەوەی گوڵی هەردەم گەشی

چیاو دۆڵ و دەشت و دەرە ،

ئەوەی هەڤاڵی پێشمەرگەو

پەیامبەری سەرکەوتنی

خۆڕاگری و بەرەنگاری ناو سەنگەرە ،

لە بیرتان نەچێ هەڤالان

ئەو کەسە نامە هێنەر و نامە بەرە

ئەو کەسە ، قەت لە یاد ناچێ

ناوی پیرۆزی ( تەتەر ) ە ! *

1995

* لە ژمارە 2135 ی ساڵی 1995 ی ڕۆژنامەی ! برایەتی !

بڵاوکراوەتەوە .

# ڕانیەی ئادار و ئازادی

پێنجەمین ڕۆژی ئادار بوو
سەردەم ، سەردەمی ئازار بوو
ئەم وڵاتە
بە فرمێسك و خوێن دیرۆكی خۆی دەنووسی
وەرزی گەڵا ڕێزانێك بوو
مەملەكەتمان بێ بەهار بوو
( ئەنفال ) ئەدرەسی ڕۆمانی
پڕ وەیشوومەی ئەم گەلە بوو
زیندان دیاریی ( بەعس ) ی هار بوو
لەو سەردەمی ئازارەدا
( نان ) گرەو بوو
ترس لە ئازادی بار بوو

پەت ملوانکەی
بووکی جوانی سەربەستی بوو
مارشی وێردی سەر زمانمان
نەعرەتەی گەرووی ئاپۆرای
شەقامەکانی ناو شار بوو !!
لە پێنجەمین ڕۆژی ئادار
لەو هەرەتی ئازارەدا
گرکانێکی پڕ گڕو قین چەخماخەیدا
لە گەروی ئەو ئازارەوە
نەعرەتەیەك بروسکەیدا
ئەو نەعرەتە .. نەعرەتەی ڕاپەڕینێك بوو
ڕاچەنینی ویژدانێك بوو
مژدەی تازە ژیانێك بوو
سیمای ڕەشی چارەنووسمان
ڕەش وەکو بەرگی ڕەشی کورد
قەترانی وەك دڵی فاشی
ئاسۆیەکی ڕوونی دەدی
وەك خۆری بەربەیانێك بوو ..

*   *

ئەمرۆکە ڕا پەڕین جەژنی ئەم شارەیە
کوڕە لاوی شارەکەی من
شۆڕە کچانی چاو قایمی ئەم بناری ( کێوەڕەش ) ە
ئەمڕۆ بۆ نوێژی ڕا پەڕین
دەستنوێژیان بە ( کوێرەکانی ) ی
قەلاَتی سەربەرز دەشۆن
لە ( زمزم ) ی ( قولە ) ی چاوگەش دەخۆنەوە
بۆ کەرنەڤالی ڕا پەڕین
( گردە دێمە ) دەدەن بە کۆلی خۆیانداو
سوێند بە گۆڕی ( فەتاح بەگ ) و
( مەنگوڕی ) ی و ( شمشارە ) دەخۆن
ئەمڕۆ جەژنی ڕا پەڕینە
شێرە کوڕانی ( دەروازەی ڕا پەڕین ) م
ڕاوی ( مەرگ و بەعس ) دەنێن
سرووودەکەی بەعسیقڕان
بۆ ( ئاهوراموزدا ) دەڵێن !
ئەی ( دەربەند ) ە شیرینەکەم

دە ئامێزت ئاوەڵاکە
جەستەی سڕبووی ئەو پێشمەرگەی
ساڵەهایە ئەو چیایەی لە کۆڵناوە
بگرە باوەش
(کێوەڕەش) ە سەر بەرزەکەم
دەرگای دڵت بخە سەرپشت
(ڕانیە) ی ئازاد و سەرفراز بکە دیاری
بیدە لە یەخەی پێشمەرگە
(زێ) یە بچکۆلە شینەکەم
دە تۆش بیشۆوە ئەو خەمە
ئەی ڕانیەکەم
پە نجەرەکانت بکەوە
ئەوە بۆنی پێشمەرگەیە
با بێتە ژوورەکانتەوە
بە ئارایشتی جوانیی ڕا پەڕین و
تاڵای سووری ئازادیەوە زەماوەندی شادی بکە
لاوك و حەیران و هۆرە
داستانی خوێن دەنووسێت و

میژوو ،
کەلە پچەی دەستی خۆی فڕێدەدات
مەسیحی ئاشتی پەروەرە
زەنگی چاخێکی نوێ ، نوێ
بۆ ئەم گەردوونە لێ دەدات
ئەمڕۆ تیماری ڕا پەڕین ،
هەتوانێکە بۆ ئازار و سەر برینم
ئەمڕۆ لە ( پێنجی ئادار ) دا ،
سەرقافڵەیە ، ڕانیەی دەرگای ڕا پەڕینم ! *
1996

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە ( 2159 ) ی ساڵی 1996 بڵاوبۆتەوە .

# گەشتی ئەستێرەی بیتوێن

بۆ یادی کۆچی دوایی

شاعیر و زانا ( میرزا مەنگوڕی )

چاومان میرزا ..

کە جەستەت بیتوێنی جێهێشت

ڕۆحی پاکت تێکەڵ بە ئاوی سازگاری

( قوله ) بووە و

لە گەڵ هەر قومە ئاوێکی ئێمەی تینوو

ڕەگو ڕیشەی خۆشەویستیی

ژیانی مەریخانەکەت

بۆ ئێمە بەراوکردەوە

کەجەستەت بیتوێنی جێهێشت

ڕۆحی پاکت تێکەڵ بە ئاوی سازگاری

قوڵە بۆوە و

پەڵەی دڵ و ..

ژەنگی مێشک و ..

تەمی هەستی زۆربەی زۆرمانت شوشتەوە

ئەو ڕۆژەی کە لە دامێنی

گۆیژەی ڕق و ماتەمینا

خەمەکانت

لە بوخچەی کۆچێکی دوور و ئەزەلیدا

داچۆڕاندە هەناوی ( سەیوان ) ی ئازیز

ئێمەش دڵی پڕ کەسەرمان

کۆستی کەوت وەکو ڕەزی زەردی پایز

چاومان میرزا ..

لە دوای ئەوەی

سەیوان تۆی میوانی کردە

کلی چاوە ڕەشەکانی

لەدوای ئەوەی ( مامەیارە ) شیعرەکانتی

کردە بەیداغی شەکاوەی یاخی بوونی

شاری هەڵمەت و قوربانی

ڕانیە ، زەنگی خرۆشان و ڕاپەڕینی لەراندەوە

بۆ تۆی کلی پێڵووی سەیوان

هەردوو چاوە گەشەکانی

( زێڕینا خانی ئامێدی ) * ی ڕازاندەوە

تۆش لەوێوە

سواری باڵی ڕاپەڕین و

سواری شەماڵی ئەوینی

بیتوێنت بووی

ئەو ئەوینەی هەناوی ستەمی ڕەشی

هەژاندەوە ..

چاومان میرزا

ئێستا تۆ لەسەر کێوەڕەش

دەڕوانییە بالآی بەرزی ڕاپەڕین و

عیشقی پاکی

ئەم ولأتە و

مەشخەڵی ئەم کوردستانە

ئاسوودە بە ..

**ئاسوودە بە ..**

**هەتا دێ ڕەواتر دەبێ**

**هەتا دێ ڕۆشنتر دەبێ**

**پەیامی پیرۆزی ئێمە و**

**ئاسۆی ئەم وڵاتە جوانە . ****

1994

* زێڕینای ئامێدی: چیرۆکێکی چاپکراوی مەنگوڕییە.

** لە ژمارە ( 1847 ) ی ساڵی 1994 ی ڕۆژنامەی برایەتی بڵاوبۆتەوە.

# مارشی شەهید

من و تۆ .. دوو کورد ،

دوو ڕێباز ،

دوو درووشم ،

دوو باوەڕی لێك دوور

وەك ئاسمان و ڕێسمان ..

من لە شاخ و تۆ هەر لە شار !

من هەمیشە دۆستی مەرگ و

تۆ ئاشنای ژین و ئاسمان

من ( شەهید ) و تۆش بێ زیان

دوای ڕا پەڕین

پاداشتی تۆ

ڕیزێك نەجمە و داڵی سەرشان

بۆ منیش .. بۆ گیانی پاکم

دەقەیەك بە پێوە وەستان !! * 1993

* لە ژمارە ( 94 ) ی ساڵی 1993ی ڕۆژنامەی ( ئاڵای ئازادی ) دا بڵاوکراوەتەوە .

# ترپەکانی دڵی پشدەر

## * قەڵادزێمان :

لە حەفتاوچوار ..

( قەڵادزێ ) مان

ڕۆمانێکی بێ کۆتایی

ئەم وڵاتە سووتماکە بوو

لاوکی بەسۆزی ئەم دڵە خەمناکە بوو !

لە هەشتاو دوو

( قەڵادزێ ) مان

چڵە نێرگزی گەشاوەی

قرتێنراوی ئەم دێیەرە ڕەشپۆشە بوو

هاوارێکی تاسێنراوی

ئەم گەرووە خامۆشە بوو !

ئەمڕۆش ( قەلا ) ی بەرەنگاری
قەلای تۆڵە و ئازادییە
مارشی سەرکەوتنی کورد و لووتکەی گۆڤەند و شادییە

*بەرنامەی خوێن :

ئێرە دەنگی گۆڕستانی قەلادزێیە
( قەلا ) ی ڕەق و
( دووزێ ) ی پڕ لە خوێنی گەشی
دوو ڕەهێڵەی
دوو هەوری ڕەش
ڕەش .. ڕەش وەکو دڵی بەعس !
ئەمڕۆ ئەشك و
خەم و شیوەن و تووڕەیی ئەم دێیەرە
پانۆرامای مێژوویێکی
خوێن لێتکاوی ئێمەیە
ئەمڕۆ ئەشك و
خەم و شیوەن و تووڕەیی ئەم ولاتە
ئاوازی پڕ سۆز و لاوك و

**حەیران و هۆرەی ئێمەیە**

**دە گوێبگرن : ئەی ئەوانەی**

**عەودالّی نان و ئازادیــن**

**دیاریی بەرنامەی ئەمجارە ،**

**گولاڵە سوورەی سەر سینگی**

**پڕ لە عیشقی بەرەنگاری و ڕاپەڕینی**

**( سنەوبەر ) و ( ئامینە ) یە !! . ***

* بەشی یەکەمی ئەم شیعرە لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە ( 1628 ) ی ساڵی 1993 و ،بەشی دووەمیشی لەژمارە ( 1930 ) ی ساڵی 1994ی هەمان ڕۆژنامە دا بلاّوکراوەتەوە .

# سەعاتەکانی نان و..ڕووخان

سەعات ، راوەستە

من دەستبەرداری تەمەنی خۆم نیم

بەهای جوانییەکان ،

ئێستاش بوونم پێك دەهێنن

من تا ئێستاش نەفەسی ئەوەم لە بەرماوە

گوڵ لە یەخەی ئەم زەمەنە نەخۆشە ،

ئەم زەمەنە ئیفلیجە بدەم

سەعات ،

بەرلەوەی ئەم زەمەنە

دواخاڵی ئەم چیرۆکە ڕەشە دانێ

راوەستە !

**تەمتومانی بێ ئومێدی**

**بۆتە بەرگی ڕۆحی چادر نشینەکان**

**ڕێگا هەموارەکان**

**گەڕیدە عاشقەکانی**

**کردۆتە پەلە دەستی بەر بەڕۆچکەی منارە**

**سەعات ، بنوو**

**با ئەم ڕۆژگارە بێشەرمە ڕابوەستێ**

**نـــــان ..**

**ئۆف ، نان**

**من دەزانم بۆ ئەمڕۆ نان**

**پیرۆزترین مارشی ئەم سەردەمەیە**

**من دەزانم**

**بۆچی دڵەکان بوونەتە ئاوێنە**

**دڵەکانی ئەم سەردەمە**

**پڕن لە هەواو هەوەسی سۆزانی**

**سەعات ، بەر لە جودایی**

**نان و ئاگر**

**بەر لە مالاوایی مرۆڤ و شکۆ**

ڕاوەستە ،

گۆڕێك بۆ ئایندە لێدە !

بەسە.. بەس

مەرگی ئەم زەمەنە و

مردنی سبەینێ ،

کەرامەتی هەموانە !

میلەکە ، مان بگرە

بائەم بازارە ڕەواجی نەمێنێ

با دەرپێی ئەم ئا پۆڕایە

چیدی نەبێتە ناونیشانی

چیرۆکی ئابڕووچوونی

ئەم چاخە بێ بەزەییە

ئەمڕۆمان ، ئەژدیهایە

زۆربەمان سەرو گورچیلەمان

پێ بەخشیوە و

ئەو هەر برسییە

ئەمڕۆ ، نان

لە ناو سیسەمی هاوسەراندا

**بۆمبێکی تەوقیتکراوە**

**سەعات ، راوەستە**

**با چیدی مۆرانەی**

**ئەم فەلسەفە سواوە**

**جەرگی ئەم جوانییە نەخوات**

**با چیدی ئەم پیرۆزییە**

**نەبێتە پێڵاوی نان و**

**نەفەسێکی دڵنیایی !**

**میلەکە ، مانبگرە**

**ئەم زەمەنە پولێك ناکات**

**ئەم سەردەمە ژەنگاویە**

**بایی ناڵی کەرێك نیە**

**با ئەم گەردەلوولە شێتە ڕابوەستێ**

**ئەم ولاتە ..**

**نیشتمانێکی بێزراوە**

**ئەم ژیانە .. گۆرانییەکە**

**گوێیەکان**

**پە نجەرەکانی خۆیان لێداخستووە**

ئەم خاکە کەلاوەی خۆشەویستییە

وێرانەی عیشقە !

سەعات وەرە دوا بزماری تابووتی

ئەم زەمەنە ..

ئەم مێژووە ..

ئەم ڕووخانە داکوتە . *

تشرینی یەکەمی / 1995

* لە ژمارە ( 2163 ) ی ساڵی 1996ی ڕۆژنامەی( برایەتی) دا بڵاوکراوەتەوە .

# خۆر لە ژوورەکەی منەوە هەڵدێ

خەمی من ، ژوورێکی گەورە

گەورە .. گەورە

بەقەد دڵی هەمووتانە

کێ بارانی لێ ونبووە ؟

هەور لە ژوورەکەی منە

کێ لەدوای نێرگز دەگەڕێ ؟

بەهار لە ژوورەکەی منە

کێ بەدوای هەتاودا وێڵە ؟

خۆر وا لە ژوورەکەی منە

لەژوورە گەورەکەی مندا

جێگا ، جێگای هەمووتانە
لەهۆڵی دادگاکەی مندا
قەفەز جێگەی زۆربەتانە
دوودڵ مەبن
ژورەکەی من ، کەشتی نووحی هەمووتانە

ئامۆژگاری دەستتان بکەن
دەرگاکەی من ناکرێتەوە
کلیلەکەی لەباخەڵی چەپم دایە
ئەمشەو دەرگا ناکەمەوە !
ـ بانگەوازی خەمەکەی من :
کێ حەز لە شەوەزەنگ ناکات ؟
کێ گەردەلوول دەیهەژێنێ ؟
با بێتە بەر پەنجەرەی من
بە شانەی پەشیمانیی خۆی
پرچی ئەم خۆرە داهێنێ.. *

1993

* لەڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان ژمارە ( 38 ) ی 1997 بڵاوبۆتەوە .

# له تاريكستانی شه‌ڕدا

( ١ )

خوله كێك و ..

سێ فلاش

چلێكی شكاو و

ژماره‌یه‌ك گه‌لای وه‌ریو

پۆلێك گیانی به‌رز فڕیو !

( ٢ )

به‌م مۆسیقایه

ته‌نیا ئه‌هریمه‌ن سه‌ما ده‌كا

گۆرانیی منیش : نه‌فره‌ته له شه‌ڕ !

( ٣ )

**مەرگ ..**

**هەموو خولەكێك مەرگ ،**

**هەموو ڕۆژێ مەرگ و**

**هەمو ساڵێ هەر مەرگ !**

( ٤ )

**ئەوە ( مەرگ ) یش دەڵێ :**

**تف .. لە شەڕ !! ***

1997

* لە ژمارە ( 38 ) ی ڕۆژنامەی ( هەرێمی كوردستان ) ی ساڵی 1997 بڵاو بۆتەوە.

# کزەی جەرگم و..خەمەکانی شەو

بۆ( هێما ) ی کوڕم

جەرگم ، تۆ بنوو
با خەمی نانی بەیانیت
خەوی ئەم شەوی من بزڕێنێ
تۆ سەر بخە سەر سەرینەکەت
با منیش مشووری دەستەسڕێك بخۆم
فرمێسکەکانی بەیانیتی پێ بسڕم
جەرگم ..

*　　　*

جەرگە ،
تۆ گەشتی خەونە ڕەنگینەکانی
خۆت بکەو
لەمن گەڕێ با لەم شەوگارە پایزییەدا
گەڵا وەریوەکانی
تەمەنی بێئومێدیم بژمێرم ،
جەرگم ..

خۆمن لەگەڵ

خەمە دژوارەکانی خۆم خاراوم

بەلاّم هەناسە گەرمەکانت و

ڕوحە پەپوولەییەکەت

ئەم ولاّتەیان لێکردووم

بە دورگەی هاتونەهات

*        *

جەرگم ... چبکەم

من تەنها بەشی خەم دەکە ، و

تۆش خۆشەویستیت لێ دەچۆڕێ

*        *

جەرگم ..

هەموو ئێوارەیەك

ئێوارانی ئەم شارە

وا دەزانم شەو تەنها دەمێنمەوە

منیش وەك شار

لەبن خۆڵی مردوودا

ترس و تەنهایی گەفم لێدەکەن

بەلاّم شەوگاری ئەم شارە
هەزارویەك خەم
هەزارویەك چیرۆك
مەرگەساتی بەیانیم
دەكەنە تابوتێكی جەنجالْ !

*　　　*

جەرگم تۆ بنوو
بامن بەدیار خەمە داگیرساوەكانی خۆمەوە
یاداشتی برسێتی تۆ و
ئەم گەڕەكە بنووسمەوە
تۆ بنوو و
بامن دلّی ئەمشەو
بەكارەساتی سبەینێی دۆزەخی
بدەمەوە !

.. كزەی جەرگم *

1997

* لە ژمارە ( 21 ) ی سالّی 1997 ی پاشكۆی ( ئەدەب و هونەری برایەتی ) دا بلاّوبۆتەوە .

# كــــۆچ

ئەم سەفەرەت .. كۆستم دەخاو
بەهاری دڵم زەرد دەكا
پێم وایە قەت ناتبینمەوە
شەرتە دوای تۆ هێندە بگریم
هەتا ئەسرین كوێرم دەكا !

* *

تۆ بێئاگای لە برینم
لە پێ دەستت بكەوە بۆم
هانێ هەردوو گلێنەكەم
با لەدوای تۆ
دیداری هیچ كەس نەبینم !
ئەی بۆ دەڵێن : ماچ شیرینە ؟؟
( ئەوەی جارێ بكا ماچێ

قەت تامەکەی لەبیرناچێ ) *

ئەدی بۆ لە جوداییدا
کام دوو لێو شیرین و ئاڵە
ماچی وەکو ژەهر تاڵە ؟!!

من ئەمڕۆکە
مەشخەڵێکی هەڵایساوم
خۆ نە ئارامی (ئەییوب) و
نە ورەی مەزنی ( سیزیف )
بەرگەی ئەم ژانەم پێدەگرن
لەماڵاوایی ئەمڕۆتا
بە جۆرێك کوڵم هەستاوە
خەریکم دەبمە دڵۆپێك لە فرمێسك
دەڵێی قەت پێکناگەینەوە
نەك هەر ئەوە
دەڵێی هەموو خەڵك دەمرن !

1990

* دەربڕینێکی مامۆستا ( هێمن ) ە .

# بۆ لێوارەکانی غوربەت

بۆ هاوڕێی شاعیرم ( دڵشادی عومەرکاکی )

دەزانم ئێستا لەوێ
لە جیاتی ( شەکرە بەفرێك )
ئاسمانەکەت ،
لۆکەیەکی پەڕەکراوە
چاوە بێدارەکانت و
دیدە بیروون ئاساکانت
سۆراغی ولاتێکی دۆزەخی دەکەن
ئەو ولاتەی ،
ڕقت لە دیتنی هەستا و
بە شێنەیی ، ئەو و دڵەکەت بەجێهێشت
نازانم تۆ ،
ئێستاش ( دەفە ) کەی جارانی و
دەهەژێی و
ڕۆحت فرمێسك دەڕێژێ ؟؟

**ئێستاکەش شەوەکانی تۆ**

**وەکو چاوی شین و مەنگی**

**دەریاکەی ئەویٚ خامۆشن ؟؟**

**خەونەکانت ، تا هەنووکەش**

**هەر بێڕەنگن ؟؟**

**دڵە گیان ، تۆ**

**لەبەر خەونی دیدارێك و**

**خەم و پەژارەی جودایی**

**خۆشەویستە دڵڕەقەکەت**

**لە کۆلانێکی قوڕاوی ئەم ولاتە ،**

**سەفەر لەگەڵ خۆی لوولیدای**

**کەچی مالاوایی دوێنێت**

**لە خەرەندی مەرگەساتی**

**غوربەتێکی کوشندەدا**

**دەتکا بە قوربانی عیشقێك**

**بۆتۆ خەمە و ، بۆمنیش خەم .. **** هەولێر / 1998

* لە ژمارە ( 94 ) ی ساڵی 1998 لە پاشکۆی ( ئەدەب و هونەری برایەتی ) دا بلاوبۆتەوە .

** ئەم شیعرەم بە ئیلهامی شیعرێکی ( دڵشاد ) بە نێوی ( ماڵئاوا ) نووسیوە .

# سەفەرو خەمێکی دیش

مەڕۆ ..
ڕەشەبای ئەم مەرگە
حەسرەتی ئەم توانەوەیە
ئەشکی غوربەتم پێدەڕژێن !
ئەمە گۆرانییەکە
ئەوینێکی شێتی لێدەچۆڕێ
نزاو نووزەی ئەم خەمە
نەفرەت لە پەنجەرە دەکات
دروود بۆ چرپەکانی ژووان دەنێرێ .
لەگەڵ هەر پێ هەڵبڕینێکت
ترپەیەکم زیاد دەکات

لەگەڵ هەر ئاوڕێکت
مردوو شۆڕێک ،
گۆڕ هەڵقەنێک
پەپولەی نێو نامەیەکم دەنێژن
خەمی سەفەر و .. خەمی نان !!
یادی بەخێر ، سەرێکم هەبوو !!
مەڕۆ..
با تەنیا نەبم
با منیش نەڕۆم .. *

دوا شەوی / 1997

* لە ژمارە ( 4 ) ی ساڵی 1998 ی گۆڤاری ( نووسەری نوێ ) دا بڵاوبۆتەوە و برای نووسەر( ئەحمەد سەلام ) کردوویەتی بە عەرەبی.

# نەورۆزی ئێمە

ڕۆژێکی تازەی تەمەن ئەمڕۆیە
گەشە دەخاتە ڕەنگوڕوخسارم
جەژنێکی گەلێك بەرز و پیرۆزە..
نەورۆزە دایکی کۆرپەی بەهارم
لەمڕۆژە جوانە هەستم دەبزوێ
پەیڤی ڕەنگاوڕەنگ دادەبارێنم
دڵی هەریەکێ کە ئەویندار بێت
بۆ دڵبەرەکەی دادەخورپێنم
گیانە دیاریی من ئەمڕۆکە بۆتۆ
چڵێك نێرگزی چاوگەش و جوانە
میداڵی یەخەی ئەم سروشتەیە
شاگوڵی شۆخی ئەم کوردستانە
نەورۆزی ئێمە ڕووگەی ئێمەیە
پەیامی جوانی و بوون و بەهایە
منێك کە عەشقی ڕۆژێکی وابم
هەرچی کە بیڵێم جوانە ، ڕەوایە

1983

# داستانی ژیان

زەمەنێکە .. ڕۆژە ، شەوە

ژیان ئاوازی گەرووێکە

ئاهو نالەی بێدارییەو

تاسەی لایەلایەی خەوە

زەمەنێکە..

ژیان گەلایەکی ناسکە

گیرۆدەی وڕەی خەزانە

یان زەلکاوێکی بۆگەنەو

گەرماوی مالی سولتانە

زەمەنێکە ..

ژیان دلۆپە ئارەقێکی

ڕەش و شینی ناوچەوانە

یان ورگی زلی بەدفەڕو

قسەگەورەی دیوەخانە

زەمەنێکە..

ژیان بارێکە

لەسەر پشتی زۆربەمانە

هەیە زرینگەی ئاڵتون و

بریسکەی خشڵ و لەرزانە

سەمفۆنیاو مۆسیقایەتی

زۆریش هەیە کەسەر و ڕەنج

برسێتی ، دوورە ولاتی

کەلاوەکۆن ،مەرگ.. بەش وجێگایەتی

زەمەنێکە ..

شمشێر خوێن لە برین دێنێ

ڕەنگی بەفر ئاڵ دەنوێنێ

سێدارە بەژنی هەر بەرزە و

مەلی گیانی هەزارەها هەڵدەفڕێنێ

ئەوەی ناویان لێناوە (هەق)

نەیتوانیوە شمشێر کولکا

نەیتوانیوە ئاڵیی بەفر بپەڕێنێ

نەیتوانیوە پەتی ستەم بچڕێنێ
زەمەنێکە ..
ژیان کانیاوێکی سازگارە
تینوو جامی تێهەڵدێنێ
ئەوەی تێرە دەیخواتەوە
نانی گەرم
گرەوێکە .. قومارێکە
کێ فێڵباز بێ ، کێ پیاوکوژ بێ
دەیباتەوە !!
زۆر لەمێژە ..
گوێمان لە بالۆرەیەکە
سەدای ( مافی مرۆڤ ) دەچڕێ
گوێمان لە بالۆرەیەکە
کە ( ئافرەت نیوەی کۆمەڵە ) و
دەبێ وەك پیاو .. بژی ، بمرێ
دەڵێ دەبێ ( کۆتری سپی ) بەس سەر ببڕێ
( پێشبڕکەی چەك ) ڕابگیرێ
کەچی دیارە

**هەمووشتێك پێچەوانەی ( ڕاست ) گوتراوە**

**( مافی مرۆڤ ) ژان و ئەشکە نجەو ئازارە**

**( ئافرەت ) هەر سێبەری پیاوە**

**باروووت و ئاسن و ئاگر**

**هونەرێکە ناوی ( زانست ) ی لێنراوە**

**( پێشبڕکەی چەك ) نەك لە زەوی**

**لە جەنگی ئەستێرەکاندا ، ئاسمان دەکاتە یاریگا**

**چارەنووس لەناوبردنە و ،**

**( قڕتێخستن ) بۆتە ڕێگا !! ***

1987

* لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (883)ی ساڵی 1987 بلاوبۆتەوە .

# تۆ ڕێبواری دوو وڵاتی

پشتت لە خۆرئاوا کرد و

ڕێت گرتەبەر

بووی بە ئاشنای گەڵا و تاوێر

ئامادەبووی بەخوێنی خۆت

ئارایشتدەی بەژنی شمشێر !

بێباکانە بە زینووی ژانا هەڵزنای

وەك دڵی مۆم

بۆ شەوانی ژوان دەسووتای

سروودی خۆشەویستی بوو

خەندە و فرمێسك و ئاواتت

عیشق لە لات پەرستگا بوو

شیرینیت لە خەمی تاڵی

ڕەشایی ئەم شارەدا بوو

بە گڕ هەموو گەردەلوولێکدا دادەچووی

خەم ، دەبوو بە خوێنی گەشت

دەبووی بە خەم

بەترپەی دڵ لەگەڵ دەنگی

(چەکوچ)ـدا ئاوێتە دەبووی

ڕۆیشتی .. ڕۆیشتی

تا بە لوتکەی گەورەترین خۆشەویستی و

گەشترین ئاوات گەیشتی

ئەو ئاواتەی بەندەرێك بوو

لە ڕێیازی کاروانی تۆ

ئەو بەندەرەی دڵخوازت بوو

دوا هەوار بوو بۆ ژیانی تۆ

* *

ئەمجارەیان تۆ ڕێبواری

تەمەنێکی بێ سنووری

ئەمجارەیان ،

**پەیامهێنەری ئاژانسی**

**کیشوەرێکی ڕووبار سووری**

*      *

**لەو کیشوەرە شوورە نیە**

**کەس نازانێ بەندیخانە چۆنە ؟ چیە ؟**

**تۆ نابیستی :**

**ئەمە نێرە ، ئەوە مێیە**

**ڕەش و، سپی**

**ئەوە کێ یە ؟**

**دەنگ زولاڵە**

**شیرینە هەر شتێ تاڵە**

**تێرە ..سەرفرازە ..شادە**

**ئەوەی لێرە کەساسە.. پیشەی سواڵە**

**ئەو هەوارە مەڵبەندی شانازی ئێمەی**

**ئەوینی خۆر هەڵگرتووە**

**ئەو جێگایە میداڵی نەمریی تۆیە و**

**بانگەوازی خاکی ئێمەی گڕگرتووە**

1987

# میوانــداری

دوێنێ شەو .. وەك شەوانی دی

بە تەنهایی لە ژوورە تاریکەکەمدا

بەدیار مۆمێکی گەشەوە

بۆ ژوانی شیعرێکی تووڕە

دۆش دامابووم

بە نامۆیی لە گەڕەکی

فەرهەنگی خەمێکی دژوار

لە پەنجەرەی ئەندێشە تەواو ڕامابووم

لە ناکاودا تەقەی دەرگا بێ قفڵەکەم

ڕایچڵەکاندم

ڕا پەڕیم و تەماشامکرد

چارەی هەڵبەستێکی تۆقیو
میوانداری بۆ ڕەوایە
بەلاّم داخەکەم کە زانیم
فیکە فیکێك بۆ ڕەشبەڵەکی
تارماییی کووچەو شەقام مۆسیقایە
زوو هەستم کرد ئەو هەڵبەستە
بە هانای هەناسەی سارد و
نامۆیی ئەو شەوەم نایە
چونکە من زۆر چاك دەمزانی
( شیعری یاخی )
نەك لە حەسحەس ،
لە بوومەلەرزەش هەڵنایە !!

1987

# من لە نێوان هێمنیی تۆ و ..
# هەڵچوونمدا

ئەوا هاتی ..
لە هاتنتا هەستم دەبێتە دەریایەك
فێی لێدێت و
کەشتی نیگا گەرمەکانت هەڵدەلوشێ
لە هاتنتا ..
دڵ دەبێتە هەناوی پڕلە گەردەشی
ئەو شەقامەی پێکی ڕەوتەکەت دەنۆشێ
هاتنی تۆ
شنەی حەزێکی شیرین و
ئاوازی بەستەی ئاخمە
دیداری تۆ
تەڵقینی مردنی خەم و
ژان و پەژارە و ئاخمە

نازدارەکەم ..

من لە نێوان هێمنی تۆ و هەڵچوونمدا

سەرم گەرمە

سەرم گڕی ناخیخۆم و

ساوای کۆشی چاوانی تۆی پڕلەشەرمە !

لەیادمە کە دەهاتی

شەونمێك بووی مژدەی گزنگت دەهێنا

شەماڵێك بووی

لە خوار گەردنی خاچەوە زرینگەی زەنگبت دەهێنا

ئێستاش لە جیاتی گزنگ و

زرینگەی زەنگی بەیانیت

دەریایەکی شین و مەنگی

کەروێشکە دەکا شەپۆلی هێمنیی

شەنگی و جوانیت ! *

1989

* لە گۆڤاری بەیان ژمارە ( 165 ) ی ساڵی 1990 بڵاوبۆتەوە .

# نامــــه

لە گڵنجانێك كارمدەكرد

بەردەنووسێكم دۆزیەوە

لێی نووسرابوو :

( ئەمە نامەی ئەهریمەنەو

بۆ دۆستەكانی نووسیوە )

بەلاَم لە پێش خوێندنەوەیدا

یەكێك خاوەن ناو و دراو

هات بە پڕتاو

گوتی : ( ئەو سپاردەی لاتە

بێنە .. كوانێ ؟ )

منیش بەبێ ململانێ

گوتم هانێ !

1985

## شیعرو خوێن

چاوەکانم وشکبوون و

دڵۆپێکم پێنەماوە

چیت بۆ بگریم ؟

خوێن .. یا شیعر !

هەتا دوێنێ گەڵایەکی

ڕەنگ زەردی نیوە مردوو بووم

بە کزەبایەکی هێمن

بە نمەنمی بارانێك .. هەڵدەوەریم

ئەمڕۆ وەکو دوێنێکە نیم

پەڵەی خەمم بە تەوژمی

فرمێسك ناشۆرێتەوە !

ئەمڕۆ وەکو دوێنێکە نیم

یادی ڕابردووی تاڵیی من

بەهیچ لەبیرناچێتەوە !

ئەی خۆشەویستەکەی من و دەوروبەرم

ئەمڕۆ هاتووم ، دەرویش ئاسا
ئەگەر نەشتوانم بتخەمە
قوژبنێکی کەشکۆڵەکەم
من دێمە گیرفانێکتەوە و
لە کفنەکەم
کۆترێکیخنجیلانە درووست دەکەم !

* *

چیت بۆ بگریم ؟؟
خوێن .. یا شیعر
خۆشەویستم ،
من پەروەردەی خەمێکی ئەوەندە گەورەم
ئەم جیهانەی لە کۆڵناوە
بۆیە هەر ئازارێك هەبێ
لە هەر شوێنێك ..
یا ئەوەتا دەمارێکم بۆی جولاوە
یان پەڵەی شیعرێکم داوە ! * 1989

* لە ڕۆژنامەی ( ئاسۆ ) ژمارە (١٠) ی ساڵی 1989 بلاوکراوەتەوە .

# یەکەم هەنگاو و دواهەنگاو

لە من و تۆ
کاممان دەستمان خستە ئەستۆی
شۆخی ئەوین ؟
کاممان ڕووناکیمان خستە
سەر ڕێیازگەی تاریکی ژین ؟
لەو ڕێگە دوورو سەختەدا
کێ یەکەمین هەنگاوی نا ؟
یەکەم ڕستەی ( خۆشمدەوێ )
کردە سروود
لە گەشتی مانونەمانا !
لە من و تۆ .. لە ڕێگادا
کێ هەنگاوەکانی شلبوون ؟

کێ چۆکی بەزینی دادا
لە هەورازی بەرە و خۆر چوون ؟
کێ کڕنووشی بۆ ستەمی
شەونخوونی وتەنیایی شەوگاری خۆی برد ؟
کاممان لە گەڵ خۆشیی خۆیدا
بێباک دەژیا و لەگەڵ مردنی ئەویدی
ئەمیش دەمرد ؟
تەنها من بووم
منی دوور لە هێزو تینی
ماسوولکە و هونەری کوشتن
منی خاوەن سۆز و گیانی لە خۆبووردن
من بووم لە شەوانی تووشی ڕێیەنداندا
لە تیغەکان یاخی دەبووم
دێوانە ئاسا بە ناخی
شەوانی یەڵدادا دەچووم !
کەچی ئەوا
بێ تۆییم بۆتە ئاوازێك
پەیامی زامێکی سەختی هەڵگرتووە

بە بێ تۆ بوومە ڕووبارێك

جودایی ، ئامێزی هەرچی دەریا هەیە

لە ڕووی مندا دا یخستووە

بەلاّم برِیارێکە و داومە

سەرم سەرێکە و هێناومە

مەحالە بگەڕێمەوە

تا وەکو کلۆیەك شەکر

لە ناو پێکی تالّیی تۆدا دەتوێمەوە ! *

1988

* لە گۆڤاری کاروان ژمارە ( 66 ) ی سالّی 1989 بلاّوکراوەتەوە .

# ئاونگی خوێن

ئەمڕۆ دەمی دەنگی شادی

زمانی نووزەی بڕاوە

ئەمڕۆ قوڵپی ناڵە و گریان

لە قوڵایی قوڕگی جیهاندا سواوە

کزەی جەرگی هەزارەها

لەبەردەم چارەی دزێوی گەردەلوولدا

وەکو داوەڵ هەڵخراوە

هەروا ئەستێرەی گیانەو

بە ئاسمانی مەرگا دەکشێ

ئەم پەیامە هاوارێکە کپکراوە

ئەم تابلۆیە ،

ناوچاوانی ئەهریمەنە و

تفی مێژووی پێداکراوە !

من خۆم ئەمڕۆ

دۆستی نزیکە پەژارە و زام و شینم

من ئەمڕۆکە

تاسەی سەدان پێناوی ئەم کوردستانە

پە نجەی ڕەشی

دەخاتە سەر ئەوکی ژینم

چونکە ئەمڕۆ

لە چاوی خوێنتێزاوی ( هێرۆشیما ) دا

دڵۆپە ئاونگەکان و

جۆگەی سووری خوێنی دڵی

شاری ( هەڵەبجە ) دەبینم !

1988

# چرۆی ئەوین

بۆ ( سۆما ) ی کوڕم

پەیامی نوێ ، ئەی زمانی سرووشتم
چرۆی سەوزی بەهاری ژینی تــازەم
چە پکە سۆزی دڵەی ئارام نەگرتووم
ئومێدی بەرز ، ئاواتی بێئەندازەم

تۆ بەرهەمی عیشقێکیپاك وگەورەی
زایەڵەی سەدایەکـی زۆر بە جۆشـی
مێژوویکی بەخوێنی گەش نووسراوی !
بەستەیەکی پڕ لە چێژو خرۆشـــی

تۆ ( سۆما ) ی‌چاوێکی‌شەوانی سەختم
دەتکرد بەراوی خەمە سەوزەکانــم
ئەو چاوانەی لە هەر دیدەنییەکــدا
هەڵیاندەڕژاند نهێنی ڕازەکانــــم

تۆ مێلاقەی ئەو کێوە سەختەی کەوا
بێبــاك بووە لە زریــان و کرێـــوە
ئەوێستاش تۆ بەگەشی وئەو بەبەرزی
سروودی گەورەیی دەچڕن بە پێــوە !

1988

* لەڕۆژنامەی ( هاوکاری ) ژمارە ( 1113) ی ساڵی1989 بڵاوکراوەتەوە .

# بۆ عاشقەکەی نان و شیعر

بۆ شاعیری جوانەمەرگ

( محەمەد حسێن هەڵەبجەیی )

هەتا ژیای
نان ، نێچیری ڕاوی تۆ بوو
هەتا ژیای
شیعر، بزەی لێوەکانت و
ئەشکی گەرمی چاوی تۆ بوو
ئەی شاعیری شارەکەی خەم
هەتا ژیای
ساتێك هەدادانت نەبوو
دەتگوت مەلی ئاسمانی شین تەیدەکەی
دەتگووت ئەوە عاشقە شێتەی
لە دەریای ونبوونی خۆتا مەلە دەکەی !

*          *

شاعیرەکەی ولاتی خەم

من دەمزانی

تۆ شەیدای گڕ و بڵێسەی

تۆ لە باوەشی ئاگردا

نان و عیشقت بەدیدەکرد

هەر بۆ ئەو نان و عیشقەش بوو

هەموو ڕۆژێ هەزاران جار

کرنووشی خۆشەویستیت بۆ ئاگر دەبرد !

*　　*

شاعیرەکەی جیهانی خەم

مێژووی تەمەنی کورتی تۆ

شەرمەزاری گەورەیی هەستونەستێکە

لە منداڵدانی دەروونی بەرینتدا

چرۆی سەوزی دەرکرد بوو

شەرمەزاری گەورەیی هەستونەستێکە

پەی بە نهێنیی ژیان و

بەختیاریی مرۆڤ برد بوو !

*　　*

**تۆش هەرگیز نیگەران مەبە ..**

**خەمبار مەبە ..**

**مێژووی تەمەنە کورتەکەت**

**بە شەرمەزاری و ڕاستگۆیی**

**گەواهی بەرزیی تۆ دەدا**

**ئاگر تەزووی چێژو نەمری**

**بە نان و شیعری تۆ دەدا**

**ئەی شاعیری ( هەڵە بجەی خەم ) ! ***

1989

*محەمەد هەڵەبجەیی شاعیر، هاوڕێم بوو ..بەداخەوە لەساڵی 1989 لە سلێمانی بەکارەساتێک گیانی لەدەستدا .

# بۆ شۆخەکەی کەنار دیجلە

ئەمشەو ..

جوانترین شت کە دیبێتم

وێنەکەت بوو

ئەی شۆخەکەی کەنار دیجلە

ئەمشەو هاورێیەکەم

جگە لە هەڵگرتنی مەشخەڵی عیشقت

گوڵی مژدەی

هەواڵی جوانیی تۆی لە یەخەدا بوو

ئەمشەو هاورێیەکەم

جگە لە سووتانی ناخی خۆی

هەواڵی شێتی و ونبوونی منی هێنابوو

*          *

ئەمشەو تەنها

من و پێنووسەکەم بێدارین

خۆ خەمی ئەو هاوڕێیەم
منیشی خوارد !
بەلام نیگەران نیم
ئەوا ، پێکێکم لە خوێنی دڵی
پێنووسەکەم بۆ تۆ نارد !

* *

ئەی نەورەسەکەی
لێوار دیجلە
کە هاوڕێیەکەم چیرۆکی تەزوو بەخشی
دواژوانی دواشەوی خۆی
لە نزیك شەپۆلەکاندا بۆ گێڕامەوە
من لێرەوە ، سووتام.. سووتام
هەتاوەکو هەموو لەشم بوو بە ئاگر
نەء.. ببوورە
نەك هەر خەمم
هەموو گیانم بوو بە شیعر ! *

1989

*لەرۆژنامەی ( پاشکۆی عیراق ) ژمارە112ی ساڵی 1989 بڵاوکراوەتەوە .

بەشی دووەم لە :

# بۆ شۆخەکەی کەنار دیجلە

ئەمشەو منیش

فارگۆنێکی شەکەتم و

هەناوم پڕ ڕاز و ئاواتی پەنهانە

ئەی شۆخەکەی ڕۆخ دیجلەکەم

ئەمشەو جودا لە شەوانە

دیدارت تاتی نوێژی

نزاو شەیدایی و سووتانە !

کە دەمدیتی

گۆنا زەرد و سیس بووەکەت

ڕازی غوربەتی دەدرکاند

کە هاوڕێکەی خۆمم دەدی

چەقۆی پەرۆشی و
خەنجەری بێئارامی
بۆ ساتێکت
لە ملی تەمەنی دەخشاند
من پڕ بە دڵە گەورەکەم
نەفرەتم لە پایز دەکرد
پێڵاوی ڕق و تووڕەییم
دڕکی ستەمی پێشێل دەکرد

*　　*

شەو ڕاشکا
من لە گێژاوی ئاڵۆزی خەمی خۆمدا و
تۆ لە حەسرەت
چەند چرکەیەك سەرفرازیت
شیعر دەستەو یەخەم بووە
ئاخ .. کە ژانێکی دژوارە
ژانێکە ، هەرگیز نامرێ
باوەڕ ناکەم
کاوەشی هیچ شیعرێکی من

کسپە و سۆزی تۆی ناسك و

بۆنسۆی ناخی برژاوی من وەخۆگریٚ

*        *

گەلاٚ زەرد باوە سیسەکەی

کەنار دیجلە

تۆ گیرۆدەی خەزانیٚکی زۆر دڕندەی

تۆ زامداری تیغیٚکی یەکجار بڕندەی

بەلاٚم چبکەم ؟

من لە یەکەم دیدارتدا

بۆ جوانیت ئەژنۆم شکابیٚ

کوانیٚ توانای ئەوەم هەیە

ئەو پیٚوەندە بپچڕیٚنم

لە ئەستۆ و گەردنتدا بیٚ ؟ *

1990

* لە( پاشکۆی عیراق ) ژمارە ( 140) ی ساڵی 1990دا بڵاوکراوەتەوە .

# ڕۆیـــشتن

سبەی دەڕۆم

دەڕۆم و .. دەگەڕێمەوە

نیگەران نیم لەم چوونەمدا

هێشووێك بیرەوەری و خەم

بە چڵی ناسکی دڵمەوە هەڵواسراوە

سبەی دەڕۆم

خەمبار مەبە ،

دەڕۆم و .. دەگەڕێمەوە

بۆ کولافەی خەمە جەنگەڵیەکەت دەبی ؟

هەر تۆ عیشق

متووی دیداری نەکردووی

خەفەت مەخۆ

من ڕووبار نیم

دڵنیابە دەڕۆم و .. دەگەڕێمەوە !

1989

# سروودی خوێن

چاوم لێیه
پا پۆڕی کاروانی ئێمه
دڕی به دەریای ڕقاوی
دڵی ئەم وڵاته داوه
چاوم لێیه
ئاسۆی ڕووناکی ئازادی
پڕشنگی ڕەنگ وەنەوشەیی
به بناری سوور و ئاڵی
دڵی ئەم خەباتی داوه
دەبێ هەرچی عیشق زامداری کردبێ
شەیدای ئەو شۆخه نەبووبێ

له ئه‌شكه‌وت له دایك بوو ؟
له ئه‌شكه‌وتی هێلانه‌ی كه‌وباڕی كوێستان
ئه‌ی ئه‌وه نیه
بۆنكرووزی دڵی هه‌ژاوی هه‌ڵه بجه
دالأشی خستۆته ئاسمان ؟!

* *

من ده‌خوێنم ..
ده‌چریكێنم ..
له قوڕگی كه‌وی ئه‌م لووتكه زیوینه‌دا
ئاوازی ئاگر ده‌چێنم
ئه‌ی ئه‌وه نیه
من له ئامێزی پڕ هیوای
سێره‌ی بڕنه‌وی پێشمه‌رگه
مه‌رگی ئاهه‌نگی سه‌یوان و
خونچه سووره‌كانی ( بارزان )
وه‌ك ته‌متومانی ژه‌هراوی
دۆڵی بالیسان ده‌بینم ..؟

* *

هەموو ڕۆژێ
لەگەڵ گزنگی بەیاندا
دەنگی ( شڤان ) وەکو گوڵمیخ
بە ناخی دڵی لاوانی ئەم شارەدا دەچێتە خوار
هەموو ڕۆژێ
سەرنجی ئاوارەی ( پەشێو )
شنەی دێنێ بەسەر مەزرای
زەرد هەڵگەڕاوی ئەم خاکە ..
بۆ نابیستن ( بەردەشانی )
دەمی بەیتی
کردۆتە قەدپاڵی سەوزی
ئەم (ئاسۆس) ە و
گڕی زێڕینی دژواری (بابەگوڕگوڕ) دەیسووتێنێ ؟
بۆ نابینن ؟
(ڕقی پیرۆز) ی پڕسۆزی (مامە هێمن )
پرچی دارستانی بەڕوو دەبرژێنێ ؟
ئەمن سەودای ئەوینێکم
بەرە بەرە لە قوڵایی پەنگ خواردوویدا

دەتوێمەوە

شەیدای بیرێکی پیرۆزم

وردە وردە لە ناخیدا

شی دەبمەوەو دەکرێمەوە !

ئەوینەکەی من .. ڕاستییە

بیرو باوەڕی پیرۆزم

مردنێکی مەردانەیە و

قوربانی ژیانێکی تازە و

هیوای بەرزی سەربەستییە

1990

* شڤان : شڤان پەروەر.

* پەشێو : عەبدوللا پەشێو.

*بەردەشانی : عەلیبەردەشانی.

* رقی پیرۆز : شیعرێکی مامۆستا ( هێمن ) ە .

# گـــریان

کە من دەگریم
کە تۆ دەگری
هەردووکمان دەبینە ڕووبار
ئێستا زانیم :
کاتێ کە ڕووبارێ بگری
گڕیش دەگرێ !

*　　*

کە من گریام و تۆ گریای
زەوی سووتا
ئاسمان سووتا
یەکسەر زانیم .. پایز دەمرێ !

1986

# دووریت له ته‌نیا شه‌وێکدا

شه‌وه .. تریفه له وه‌نه‌وز دا
شه‌رابی کۆچی وا ده‌خواته‌وه
به ئاوی ساز و ڕوونی کانیاو
گلێنه‌ی سوێری خۆی ده‌شواته‌وه

له‌م شه‌وه زه‌نگه‌ی ئه‌م ده‌وروبه‌ره
ته‌نیا هه‌ر ئه‌وبوو هاوده‌می گیانم
هاوبه‌شی خه‌م و ماته‌میم ئه‌و بوو
هاوڕێی تاقانه‌ی شه‌وی سووتانم

وا ئەویش ڕۆیی .. ماڵاوایی کرد
پێینۆشیم بادەی تاڵـی جودایی
لە ساتێکی پڕخامۆش و غوربەت
بوومە هاوەڵی دنیای تەنیایـــی

ئازیز ئەمشەویش وەك شەوانی زوو
دووریت گرێکــە لە سینەمدایـــە
تەنهــا بە یادی ژوانـــی جارانت
نەبێ ، دڵ هەرگیز ئۆخژنی نایە

ژانی دووریت بۆم وەك زیندانێکە
تاســەی ئازادیم دەکاتــە ڕازێ
کێ هەیە ساتـــێ بێ دڵبەرەکەی
ئۆقرەیەك بگرێ و مەرگ نەخوازێ ( * )

1986

*لەگۆڤاری (کاروان) ی ژمارە ( 50 ) ی ساڵی
1987 بڵاوکراوەتەوە .

# گوڵە پایزی

لەم وڵاتە
لە وەرزی گەڵارێزاندا
بناری چیا سوور دەبێ
گەرووی سروودبێژ دەنووسێ
گوڵ دەوەرێ ..
بێزاری بێ سنوور دەبێ ..
بەرەبەیانی دوێنێ بوو
لەو بناری ( کێوەرەش ) ە
چەند بێچووە شێرێکی چەلەنگ
چڕنووکیان لە دڵی ڕەشی ستەم چەقاند
بژاری ژەهراوی و پیسی
مەزرای ئەم شارەیان سووتاند
پشتی ئەهریمەنیان شکاند

هەموو خەڵك كەوتنە شادیٚ
گوێی دەشت و كێو ئاوالاّ بوو
بۆ شەپۆلی سەدای بەسۆزی ئازادی
بەلاّم هەزار داخ و كەسەر
لەو ڕەوە شێرە گیانبازە ،
لەو ڕێبوارانی هەورازە ،
لەو كۆمەڵە ژیان خوازە ،
شەش قارەمان
شەش ئەستێرەی گەشی ئاسمان
خوێنی گەشی خۆیان بەخشی
بەگەردنی كێوەكەم و
بە ڕوومەتی زەردی خەزان
تاكو ڕۆژگار وانەزانیٚ
خاكی كوردان بیٚ بەهارە
هەتا رەقیب وا تێنەگا
زێدی كاوە ،
بەبیٚ گولاّڵەسوورەیە و
ڕووی پایزی پێوە دیارە !

1984

# ئه نجام

بەرەو هەناوی كارخانە

لە ناو پاسێكی وەكو خۆت

لەرزۆك و شەكەت دانیشتووی

لەو شەقامەی ئەوبەرتەوە

هاواری گزۆزی توورەی دوا ۆدێلێك

تێكەڵ بە هەناسەی سارد و

نەرمت دەبێ ..

تۆش بەرێوە

بیرێكی قووڵ هەڵتدەگرێ :

( تۆ دارتاشێكی دەبەنگی و

منیش تابووت

دڵنیابە

ئامێزم كەژاوەی كۆچی

تەرمت دەبێ ) !

1986

# شیعر و سووتان

شەو درەنگانێکە و سەرم
بۆتە تۆپی
گۆڕەپانی یادەکانم
هەتاکو درەنگتر دەبێ
پتر هەست بە نامۆیی و تەنیایی دەکەم
ئەرێ ئەوە بۆچی ئەمشەو
دەرگا کلۆم دراوەکەم
یەك دوو جار ڕاناتەکێنی ؟!
دە وەرە دەی
خۆ من قینم لە تەنیایی دەبێتەوە
وای ، لە زەبری شەوی ئاوا
هەرچی کۆنە زامم هەیە
لە ناخەوە دەکۆڵێتەوە !
من لە شەوانی وەك ئەمشەو

تەنها شیعر هاودەنگمە

تەنها بۆنی گوڵی شیعر

خەم ڕەوێن و سفتوسۆی دڵی تەنگمە

دە وەرە دەی

پەریزادە بێخەمەکەم

وەرە و ڕاژێنە لانکی سەری مەستم

وەرە و تاوێك ، تەنها تاوێك

بمبەخشە بەم دڵەی پەستم

دە وەرە دەی

با شیعرێکم داگیرسێنم و

هەست بە تەنیایی کردنم لا نەمێنێ

خۆشمدەوێی ، بڕوابکە خۆشمدەوێی

دڵنیابە ،

ئەوەی یەکێکی خۆشنەوێ

دڵیخۆی بۆ ناسووتێنێ ( *

1990

*لەڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق ژمارە( 138 ) ی

ساڵی1990 بڵاوبۆتەوە .

# یاخیبوون

ئەمڕۆ دڵی گەورەی دەریا
زۆر تەنگ بووە
ئەمڕۆ مەندیی وەك گرکانێکی فێدار و
پڕ تووڕەیی لێهاتووە
دەریا ، ئەمڕۆ
بیرەوەری ساڵەکانی گڕگرتنی
کیشوەری بەفر و کرێوە دەکاتەوە
بە شە پۆلی یاخیبوونی
لیستی ڕەشی پڕ تاوانی
ئەم( هیتلەر ) ە دەشواتەوە !

*          *

**ئەی دەریا گیان ،**

**هەرچەند هاتووم**

**بەلاَم منیش دەستەبەستم**

**منیش دەروون پڕ لە گڕم**

**لێمگەڕێ با**

**قەتماغەی زام هەڵنەپچڕم**

**بەلاَم گیانە ..**

**بەڵێن بێ ، بەڵێنی کوردێك**

**کە چوومەوە سەرگوزەشتەی**

**بۆنسۆی هەناوی بیابان و**

**هالاَوی تۆی دڵ پڕ برین**

**ببەم بۆ کوێستانەکەم و**

**بیکەم بە یەکەم پەیامی**

**بەرەبەیانی ڕاپەڕین ! ***

**شووباتی 1991 / کوێت**

* ئەم شیعرەم لە ساڵی 1991 لە نامەیەکدا لە(کوێت ) ە وە بۆ خاتوو (کەژاڵ ئەحمەد) ی شاعیر نارد بۆ کەلار، لە وەلاَمی نامەیەك و چەند شیعرێکی ئەودا کە بۆی ناردبووم بۆ ئەوێ ..

# دوو بانگەواز

* ( .... ی ئادار ) :

بانگەوازە ..

لە بڵندگۆی ناوشارەوە :

( بۆ ئەو کەسەی مەردی چاکە و

گرووپی خوێنەکە ( A ) یە

زۆر پێویستیمان بە خوێنە

زامدارێکە و

لە قاوشی نەخۆشخانەیە ! )

* ( 5 ی ئادار ) :
بانگەوازی ئەمجارەمان
لە هەناوی گڕ تێبەربووی
ئەم خاکەوە ،
لە جەرگ و دڵی سووتاوی
ئەم دایکەوە :
( بۆ هەمووتان
بۆ سەرجەمی گرووپەکان
پێویستیمان .. بە جۆگە ، بەزێ ،
بە دەریای خوێنتان هەیە !! ) *

رانیە / ئادری/ 1991

* لە ژمارە ( 1 ) گۆڤاری 5 ی ئازاری 1991 بڵاوبۆتەوە .

# قەندیل

قەندیل ڕیشە
ئەمساڵ سپیترە لە پار
قەندیل گومبەزی ڕووشاوی
نێوان چوار منارەکەیە و
پەرستگایە بۆ خەڵکی شار
من هەڵۆیەکی قەندیلم
هەموو ڕۆژێ
لە سەر لووتکەی سەرکەشیەوە
باڵم دەشکێ و دەکەومە خوار
کەچی ئەو هەر سەری بەرزە و ..
بەفریش ماڵاوایی ناکات
هەتا دوا هەناسەی بەهار

1979

# کــــۆڕەو

ئەمڕۆ ڕەوە
ڕێگا دەڵێی
تەسبیحی نەسرەوتی شێخە
لەم ڕەوەدا
گیانی عیسا بۆ بەرزییە و
لەشی هەڵواسراوی مێخە
ئەمشەو شەوی دابڕانە
من و ژن و منداڵە بێ نازەکانم
دەڕۆین .. دەڕۆین
دەڕۆین و کۆتایی نایە
هەموو شتێکمان جێ هێشتووە
تەنها بوخچەیەکمان پێیە
ئەویش سۆزی نیشتمان و
عیشقی ئازادی تێدایە !
ئەمڕۆ ڕەوی هەموو شتێکە

ڕەوی گیاندار..

ڕەوی مرۆڤ ..

ڕەوی بەفر ..

ڕەوی بارانە لە هەور

سەیرکەن ڕەوی ملیۆنە

لە زەبری ستەم و جەور !

هەرچی کوردە

یان لەگەڵ ئەم کاروانەدا

ڕەوی هەڵوێستی کردووە

یاخود لە زیندانەکاندا

کۆت و پێوەند ڕێی گرتووە !!

ئەمڕۆ ڕەوگە

بۆ خنکانی داگیرکەر

دەریای بێبنە

ڕەوگە مارش و

سرووی سەرکەوتنێکی

خوێناوییە و

تەڵقینی مەرگی دوژمنە !

نیسانی / 1991

# لووتکـە

چیا گەڕا ..

بۆ بەردێك بیکا بە لووتکە

هەرچی بەردی بنار هەبوو

هەریەك دەیگووت :

( ئەمە مافی ڕەوای منە )

یەکیان گووتی :

لە ئاوایی

من هەمیشە دەبمە دیوار

بەردێکی دی :

من خۆم کردووە بە بەردەباز

بۆ یارمەتی ڕەوتی ڕێبوار

بەردێکی دی گوتی :
لە وەرزی زستاندا
من باگردێنی سەربانم
لەگوندو شار
یەکێکیکە گووتی : منیش بوومە دەستاڕ
بۆ ژیانی دارا و نەدار
لەولاوە گاشە بەردێکی
تووڕە و بزێو
سەری لە سوێ هێنایەدەر
گووتی : ( لووتکە شوێنی منە
چونکە من لە ڕۆژی گرِدا
بۆ پێشمەرگە بوومە سەنگەر ( )

1991

* لە یەکێک لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی ( ئاڵای ئازادی ) ساڵی 1991 بلاوبوتەوە ..

## سروودی ٥ی ئادار

شاری ڕانیەی قارەمـــان
مەڵبەندی بەچکەشێران
ڕا پەڕی و دەستی وەشاند
سەرکەوت و دنیای هەژاند

دەروازەی ڕا پەڕیـــن بـــوو
پڕیشکی یەکەمـــین بـــوو
بۆ پێشمەرگەی کوردستان
نەعرەتەو هێز و تین بوو

له ڕۆژی پێنجی ئادار
ڕاپەڕین برسی و هەژار
بە هێزی بیر و بازوو
ڕووخا قەڵای ستەمکار

ئەما ڕۆژی بێدادی
کوردستان کەوتە شادی
بە خوێنی گەشی لاوان
بەراو کرا ئازادی

لە بیتوێنی سەوزی ژین
گڕکانی پیرۆزی قین
شەهیدان بوون بەنێرگز
بۆ بەهاری ڕاپەڕین
1992

*ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەندا ( هیوا مستەفا ) ئاوازی بۆ دانراوەو بۆتە مارشی راپەڕینی رانیە.

# ڕۆیشتن بەسەرئاودا و..
# کوڕەکەم

بۆ ( نوا ) ی کوڕم

بابم خەونی بە منەوە دەدی
منیش بە کوڕەکەم
هەردووکیشمان بە خە نجەر و
چەند دۆنمێك زەوی بەراو
دوێنیٚ هەردوو پێم بەرە و لێوار
لێم جیابوونەوە
هەر ئەوەندە
شوێنەواریانم بۆ دیاریکرا
تا لە دەریادا نقومبوون
شوێنەواریان
لە شوێنەواری جووتە لێوێکی
لە سووراو هەڵکێشراو دەچوو
بە ڕوومەتی زوورمەوە ( * )

شوێنەواریان ..
لە برینی خاکێکی نەناسراو دەچوو
ئەو خاکەی هەناسە خنکاوەکانی
وەکو شوێنەواری پێیەکانم
وێڵ بوون ..
ون و سەرگەردان بوون ..
ئەوە ڕێژنەیەك ژەهر باری و
شوێنەواری پێیە عەجوولەکانی
منیشی سڕیەوە !
ئاوی دەریا
ئاوی باران
پێیەکانم بۆ کوێ بڕۆن ،
چ پەنایەك دالدەیان دەدات ؟.. **

1999

* زوور : زبر

* لە ژمارە (١٢٦) ی ١٩٩٩ ی پاشکۆی ! ئەدەب و هونەری برایەتی ! دا بلاوبوتەوە .

# دەبا بۆ من نوایەك بای

تۆ هەر میوانی ئەو کەشتییە نەبووی
هەوای تەی دەکرد
ئەو کەشتییەی ،
ڕۆحی ئێمەی بۆ ( شەبچراغی جوودی ) *
بەژن زراڤ و ( چراخان ) ی بادینان دەشەکاندەوە
ئەو ڕۆژە کەشتییەکەی ئێمە
لە ئەتمۆسفیری جیهانی تۆی نیان
سەمای دەکرد و
نزای ( نووح ) ێك
فریای نقووم بوونی نەدەکەوت
* *

تۆ پەنایەك بووی

بۆ شە پۆلە تووڕەو فێ لێهاتووەکان ،

بۆ غوربەتێکی نێو ماڵی خۆمان ،

تۆ ئەو پەنایە بووی

دەروێشە شێتەکەی تەکیەکەمان

ویستی مژێك لە ئیستاتیکای

پەیکەرە ڤینۆسییەکەت بدات و

تاسەیەك بکاتە کۆکتێلی بەر لە مەرگ

بەلام ئەفسوس ،

ئەویش و ئێمەی شێتخانەکەشمان

بەر هیستریای ئەو سێلاوە کەوتین

کە هەر بەیانی بوو بە زیخ

*          *

لەو شێتخانەیەدا ،

من لە هەموان شێتتر بووم

ئای .. لەو تووڵە خەونە

خەونێك ، تەنها بۆ من پەنایەك بای

بەلام هەزار نەفرەت لە شەو

هەزار نەفرەت لە جودایی
کە تامی تفت و تاڵاوی غەیب بوونی
تۆی پێ چەشتم

*        *

حەسرەتم بوو
دیوارێکی شووشەبەندی
هەندێ دزێو .. کەمێك جوان
لە نێوانی چاوا نمدا بۆتە سنوور
بەلاَم ئێستا ، چەندین دەریا و
دەیان شاخ و بازگەو پۆلیس
(کێوی قاف) ن !
داخم ناچێ .. پەنای من بای
نزیك ، نزیك .. نە ئاوا دوور ..**

2000

* جوودی : مەبەست چیای جوودی یە.

* لە ژمارە ( ٢٠١ ) ی ٣/ ١١ /٢٠٠٠ ی ( برایەتی ئەدەب و هونەر ) دا بلاَوکراوەتەوە.

* ئەم هۆنراوەیە،مامۆستای هونەرمەند ( سەید ئەحمەد رەواندزی ) ئاوازی بۆ داناوە و هەردوو هونەرمەندا هەردی سەلاَح ) و ( ئالان عومەر ) بە سروود تۆماریانکردووە.

# منـــى درەخت

ئای ، من و ئەو درەختە
وەکو یەك واین ..
من و ئەو درەختە
لە خاکێکدا ڕسکاین
من ساوا ، ئەو نەمامێك بوو
رەگمان بە خۆشەویستی
خاکێکدا ڕۆچوو
هەر بۆ ئەویش گریاین .. سووتاین
* *

من وئەو درەختە
بە سێبەر و بە بەرمان
ئێوەمان ئاسوودە کرد
من و ئەو دەرگای ئێوەمان کرپیەوە
کەچی ئێوە دڵی منتان
کونکون کرد و
ئەوتان بەتەورێك بڕیەوە

* *

من و ئەو درەختە ..
ئەو چارەڕەش و، نانی من بێخوێ
نازانم ئەو چیلێدێت و من دەچم بۆ کوێ ؟

* *

من و ئەو درەختە وەکو یەك واین
من تەمەنم هەڵدەکشێت و
ئەویش بەژنی ..
ئەو لە هەموو پایزێکدا
زیاتر گەڵا دەوەرێنێ
منیش هەموو سەری ساڵێك

چاوم پتر ڕێژنەی ئەشکی
بیرەوەری تاڵ و شیرین دەبارێنێ

*　　*

ئەو درەختە دەبێتە سێدارەی من و
من گڕی ئەو دارستانە !
داخەکەم ، هەردووکمان
تاسەباری ئەم خاکەین
ئەو خاکەی من بۆی گریام و
ئەویش بۆی سووتا !
من و ئەو درەختە وەکو یەك واین .. *

شەقلاوە /2000

* لەگۆڤاری کاروان ژمارە ( 161 ) ی ساڵی ٢٠٠١ بلاوبۆتەوە .

# مــۆری لێــو ..

کێ تۆی ماچکرد ؟
کێ شیلەی لێوەکانی تۆی
قوم قوم مژی ؟
- (دەبێ بێتە بەر سێدارە ! )
ئەمە بڕیاری پاشا بوو
جاڕدرا لە نێو ئەم شارە
گەڕان و سۆراغ و پرسیار
پۆل پۆل هەموو ،
قۆڵبەست کراین بەرە و دمربار
کاتێك زانیم ڕا پێچکرام
بۆ بن پەتێك لە بسکی تۆ
هێندەم زانی هەڵیانواسیم ،
بە دارێکەوە لە بەژنت
کاتێك خنکام .. بووم بە تەرم !
ئینجا زانیم :
( مۆری لێو ) م شاهیدی دابوو لە سەرم * هەولێر /

* لە رۆژنامەی برایەتی ژمارە ( ٣٨٣٣ ) ی ٢٠٠٢ بڵاوبۆتەوە .

# لەئێوارەیەکدا .. هیــوا

پیرانی ولأتەکەم کە لاوبوون
لە خەرەندێك پەڕینەوە
( دیجلە ) یەك بوو لە خوێن
کە گەلای وەریو
ملی بۆ ( بـا ) نەدەدا
نە خە نجەر قینی لە خوێن بوو
نە درەخت لە سێبەر و
نە خۆر لە تیشك ..
نە پیرانی ولأتەکەشم لە دوێنی

پیرانی ولآتەکەم و منی نیوە پیر
لێشاوێکین لە پرسیار
جیهانێك پڕ لە هیوا
دەخوازین ،
دەرباز بوباین لەم دورگەیە
ئەو پە نجەیەمان گەستبا
کە ئاماژەیە بۆ پەیامی
پەشیمانیی مانەوە لەم بەهەشتەدا
بەهەشتی یاسای لاسەنگی و فەرامۆشی
ئەو یاسایەی فێری کردین ،
چۆن بخەسێین !
فێری کردین ،
لە دوورەوە نیشتما نمان خۆشبوێت و
لە غوربەتدا ،
تاسەباری ماچی ئازیزەکا نمان بین ! *

هەولێر /2002

* لە گۆڤاری کاروان ژمارە ( ١٦٦ ) ساڵی ٢٠٠٢ بلآوبوٚتەوە .

# ئاسکەکانی کێوەڕەش

کە شەبەنگی خۆری من
چنگی لێکناو خۆی پێچایەوە
ئەبلەقی هەناسە ئاڵتونییەکانی ئێوەش
بە بەژنی ( کێوەڕەش ) ە وە
پەڵە پەڵە کاڵبوونەوە
ئەودەم ڕۆحی منی لە بووخچە پێچراوی
لە چەشنی گوارەی
لامل لە پەڕەی گوڵ ناسکتر و
بەژنی شەنگتر لە لە نجەی
( کوێرەکانی ) ی ئێوە
لە سەماکەوت !
من لەو سەفەرەدا و ،

له پيش سه‌فه‌ردا
له‌بيرمه بوخچه‌كه‌م كرده‌وه و
لويچيك له ياده‌كانم تيكه‌ڵ به ڕوحم
له داميني ( گوڕمريه‌مى مه‌نگوڕی ) دا
كرده په پوله‌ی ناخم و
باوه‌شيني هه‌نيه‌ی شه‌و نماوی
سه‌فه‌ره‌كه‌مم كرد
ليره‌كانه .. ئاهه‌كانی دايكم و
نيگاكانی ئيوه‌ی چاوكاڵ و
ليوه ته‌ڕه‌كانی ( قوله )
په‌يامی سوزی ناكام و
چيژی حه‌زيكی ئاشقانه
شنه‌ی شيوانيان بو ده‌ناردم
ئای سه‌فه‌ر ..
سه‌فه‌ری جودايی
من سه‌فه‌رم كرده پاوان و
كردمه دارستانی چاو
تاكو هه‌موو به‌هاران

نازی ئێوەی ئاسك و

ژوانی ئێوەی دڵدار و

پەیمانی ئێوەی بە وەفا

وەکو پەڵەیەك

کەهەمیشە پێی دەڕوێمەوە , ببینم

لەدیمانەمدا ..

بووخچەکەم گەورەترو

تەمەنم بالآتر و

شارەکەم دەریاترە ..

ئێستا لە پشتەوەی چاویلکەکەمەوە

خۆم بۆ تیلەنیگایەکی

ئاسکەکانی کێوەڕەش مەلآس داوە ..

ئاسکەکانی خرۆشان و ئازادی

هەر جۆرێك بن

گچکە بن یان گەورە ،

دەیانناسمەوە

شۆخی و شەنگی و ڕەندیی ئەوان

هاوارێکن ,سەدایان دەگاتە

ئەوسەری مەملەکەتی  عیشقم
ئاخر ئەوان
مرواریەکانی جوانی و
ئاسمانی وەفا و
سیحری ڕەنگەکانیان
بەنرختر و ،
بەرزتر و ،
درەوشاوە تر ،  کردوە
ئەوان دژی گەلاڕێزان  و
دژی گەفی ئەودیوی مەرگ  و
دژی ستەمی تاریکین
بۆ منیش نۆژەن  بوونەوەی
تەمەنێکن
دڵم بۆ جوانی ئەوان  و
بۆ شیعر پرژێنی گوڵزارەکانی
ئەم دەڤەرە  دەکاتەوە  . *

ڕانیە/ تەمووزی 2004

* لە رۆژنامەی ( خەبات ) ساڵی ٢٠٠٤ بلاْوبۆتەوە .

# دیـــاری

تۆگووتت :( شیعرێ پێشکەشی من کە
بۆ یـادگاری لە لام بمێنـــێ ..
با نهێنی بێ هەر خۆم بزانم
چاوی ڕووناکی هەرگیز نەبینێ )

منیش پێتدەڵێم : کام شیعرت دەوێ
بیکەی بە دەرمان بۆ دەردی گیانت
لە دونیای نامۆ و تەنیایی خۆتدا
بیکەی بە هاودەم کاتی سووتانت ؟

ئەی شۆخی نازدار, کیژۆڵەی لەبار
باڵا شەنگەبی , جوانی ئەم شارە
مێلاقەی ناسکی کوێستانی بەفرین
توولەنەمامی ئەو قەد بنـــارە

شـیعرلەلای من شـیوەن و ژانـــە
ئاوازی دەنگی عیشقی خاوێنـە
شـیعر لەلای من سـۆزی دڵانـــە
گڕی بە تینـی هەناو سـوتێنە !

وا بڕیارمدا تاکە شیعرێـکم
پێشکەش بە تۆبیّ بۆ یادگاری
دەزانم تاسەت چەندە بەتینە
ڕازی خۆت بۆ من کردە دیـاری
شیعر ناسکە.. بۆتۆی ناسـکە
بیکە بە گوڵ و بیدە لە سینگت
شیعر جوانییە , بۆ جوانیش جوانە
دەبا دیاری بێت بۆ باڵای شەنگت

**تۆش گوڵی جوانی خۆشەویستم بە**
**نەوەك هەر شیعرم دڵم بخـوازە**
**بە دیـاری وەرە و میوانی مـن بە**
**ئەی نەونەمامی بەهاری تـازە**
1984

# خەمی شیرین

ئەی خەمە شیرینەکەی من
ئــــازارە پڕ لــە چێژەکــەم
بۆ لــە ناکاو خۆت بزرکرد
لــە چاوە ئەشکرێژەکــەم

*  *

دیاری تۆ بۆ من خەم بــوو
منیش بۆ تۆ خۆشەویستــی
جـگــەلــە پە یمان و وەفــا
هیچی دیکەم لێنەویستــی

*  *

هــەموو ڕاز و ئاواتـــــی من
شـــکۆفەی ئەوینــی تۆ بوو
خەونی بەدی نەهاتووی من
تــاسە و خەمێکی بەســۆ بوو

*          *

وێـردی دڵ و سەر زمـانـــم
دڵـنەواییت بــوو بۆ شـادی
کـەچی منت کردە دۆسـتی
فـەرامۆشــی و نامـرادی

*          *

عیشقی پاکم لەگەڵ خوێن و
فـرمێسکی تۆ تێکەڵ بـبوو
ئـەوینی مـن وەکو ئـاگـر
لـە دەروونتـدا هـەڵبـبوو

*          *

ئێستاش تۆ لە کەژاوەکەی
دوا ڕۆژی نــــادیــارت
یادم دەکەی بە ناونیشان
بۆ ئەلبوومی تاسـەبارت

هەولێر / ٢٠٠٥

# تەوارێك لە بەرزیدا ..

ئەوەی لە چیا بەرزتر بوو تەوارێك بوو ( * )
لە باخی ئاوازدا گوڵی بەهارێـك بـوو
وەرەی پۆڵا بوو بۆ پێشمەرگەی هەڤـاڵی
بۆ خەمی دایكی شەهید تـاسەبارێك بوو

*　　*　　*

هەستن ، ئەوا هاتەوە ڕوحـی بەفرینـی
دڵی گەورەی پڕ ئومێد و هیوای ژینـی
تـا دوێنێ (خۆر) لە سەر سەری بەرەولووتكە
ئەمڕۆش لەسەر سینەی پڕ عیشق و ئەوینی

*　　*　　*

خامۆش خامۆش بە خەمگینی ڕیز ببەستن
ئێوە بە دەنگی زولاڵی ئەو سەرمەستن
دەست لە سەر دڵ ، سلاو بکەن لە کەژاوەی
ئەی ئەوانەی دڵبەندی هیواو مەبەستن

* * *

چ سەودای عیشق و ئازادی ، چ بالا بوو
چریکەی نیشتمان و خاک و ئالا بوو
ئازادیخواز و دڵسۆز و ئەمەکدار بوو
تا ئەو ڕۆژەی جەستەی لە ئالا ئالابوو

2006

* تەوار : هەڵۆی مێ .

* ئەو ڕستانەی هێڵیان لە بن دراوە لە گۆرانیەکانی ( مەرزیە ) م وەرگرتووە .

# تیشك

گەرچی دوورم
هەرچەندە لە نێو زیندانی
نامرادیم
بەلام هاورێ .. دڵنیابە
وەك پەپوولە
هەڵوەدای تیشکی ئازادیم
1985

## بەرزی

تۆ وەکو قەندیل بڵندی

تا لێت نزیك دەکەومەوە

زیاتر بەرز دەبیتـــەوە !!

1980

# پرسیار

چاك دەزانم كە هەر بۆ تۆ

من دەكێشی قومی مردن

بەس نازانم ..

ئەمن بۆتۆ دروستكرام

یا تۆ بۆمن ؟!

1984

# لە سەفەردا .. خەمێکی شیرینتر

دیارە من کاراکتەری
بەشی دووەمی ئەو سەفەرەم
ئەمە بەختێکە ئەگەر نەمەوێ
درۆزن و ترسنۆکم !

پەردەی یەکەم !
ختووکەی حەزێکی ئاڵ بوو
پەردەی یەکەم لەم سەفەرە
دەریایەك ئەشکی ئەفسانەیی
کردە ئامێزی چارەنووسێکی بێزراو !
تۆ بۆ زەحمەتی ئەو ڕێگایەت لە کۆڵنا ؟
بۆهەموو خەونە ڕەنگاڵەییەکانی خۆتت
لە هەرەمی تار و
ئەستەمی ستەمەکانی
فیرعەونەکانی برِیاردا گۆڕەوشار کرد ؟
ئەی فریشتەی ماناکانی میهرەبانی ،
ئەمە خەمەکانی عیشق و
ئازارەکانی ئەو کۆچە بوون
سرووتی پەرستگای بتەکانی پیاوی
بۆ تۆ کردە پەیامێکی قەتیس !!

*       *       *

تۆ زەمەنێك
بۆ بەهاکانی جوانی بوویتە قوربانی

بۆ گوڵە هەڵوەریوەکانی بەهەشت

بوویتە مەزرا

بەلاّم نەتتوانی

لەژێر قەمچی ئازارەکانی ستەمی هاوڕێکەت

نووزەیەك ،

هاوارێك ، بکەی بە یادەوەری

* * *

پەردەی دووەمی بێپەردەی

زۆر بێ ماناى سەفەرەکەت

وەرزی بارینی خەم نییە

ئەی فریشتەی میهرەبانی

ئەمجارەیان مەنزڵگای حەزە تازەکەت

تاریك و تەلدڕوو نییە

* * *

تۆ ،

چیدی لە هەور مە پرسە

ئەشك چییە ؟

سیحری سووتان

لە ئاتەشگەدە فێرمەبە
ڕق لە شمشێر دا بماڵە
بۆ سۆز بژی
بژی بۆ پەیڤێک
لە دڵێکدایە و ئێستا گۆ نەکراوە
سەما بکە بۆ ئاوازێک
نەفرەت لە دوێنێ دەکات
بمرە بۆ عیشقێک
وەکو مۆم لە دڵتدایە

ئەمە ئەو تاسەیە ئەگەر دەرینەبڕی
درۆزن و ترسنۆکی !
ئەی فریشتەی میهرەبانی ..*

حوزەیرانی ٢٠٠٦

* لە ژمارە ( ٢٠٧ ) ی گۆڤاری کاروان ساڵی ٢٠٠٦ بلاّو کراوەتەوە .

# مـــۆدێـل

**شیعری میللی**

ئێوارەیە و

دێی و بەرگێکی بەهارییت لەبەردایە

نیگاکانت ماوەبڕنین

شەرم و شکۆ دەکەی گوایە

چەتیو نەبی

بۆ ئەو بالاّ شەنگ و شلەت

خەریکە کوێرایم دایە

بێقەزا بی ، کچی چابە

خوا عالمە

دلّم بۆت تکەو کەبابە

* * *

بەلە نجە دێی بەشەقامدا

پێڵاوەکەت پاژنە بەرزە

تەقەی، دەنگی مۆسیقایە

بانگەوازی گەنج و هەرزە

ئەگەر بە قیست نەکڕدرابێ

ئەوا دیارە هەمووی قەرزە

کچێ خواو بێ

دڵم سەعاتی ( بیگبن ) ە و

لەندەنی هێنایە لەرزە !

* * *

ڕووخساری ئەفسووناوی تۆ

دەمێك خۆشەو دەمێك مۆنە

هەموو گە نجی ئەم گوزەرە

شەیدای نیگایەکی تۆنە

بەلآم وەکو من بزانم

خەیاڵت هەر لای ( ساڵۆن ) ە

( نیگرۆو ئەسەدی و دالآسی و

برێکی نەبێ .. نووی عەییە ) !

ئەوەی دی تەسریحەی کۆنە

ئەرێ ماڵ خراپ نازانی
دڵم پەپولەی باڵاتە ؟
ئۆباڵ بەملم
تەڕایی ئەو لێوە ئاڵەت
هەر دەڵێی ئاوی حەیاتە

* * *

منی ماڵوێران کوشتەی تۆم
تۆش کوشتەی زەبری مۆدێلی
کوشتەی نرخی نێو جامخانەو
بازاڕی ڕەشی پڕ فێڵی
بەڵام گیانە .. چاك بزانە
تۆ بەلاگێڕی نەهاتی و
هەرەسی سەرمایەداری
داخی منیش هەر ئەوەیە
مۆدێل بۆتە شێرپەنجەی تۆ و
تۆش بویەتە دەردو بەلای
دنیای تاریکی هەژاری !!

١٩٨٨